# چوار طاغوتەکەی ئەهلی تەعطیل



ئەو بنچینەیانەی جەهمی و موعتەزیلی و ئەشعەری و ماتوریدیە پەکخەرە زەندیقەکان بەکاری ئەهێنن بۆ پووچەڵ کردنەوەی کەلامی الله تعالی و وتەی رسول ـەکەی ﷺ و کافر بوون پێی و سەرخستنی هەوا و ئارەزوو و عەقڵی پووچی خۆیان و جەهلی کەلام بەسەریاندا

ئامادەکردنی :

**الشاب السني**

١٤٤٥ هـ

**ابن تيمية** لە **(الفتوى الحموية لاپەڕە ٢٤٣ تا ٢٥٣)** ئەڵێ :

(بنچینەی ئەم وتەیە وەرگیراوە لە خوێندکارانی یەهود و موشریکین و صابیئیەکان، یەکەم کەس لێوەی ئەگێڕنەوە کە ئەم وتەیەی لە ئیسلامدا وتووە الجعد بن درهم ە، وە الجهم بن صفوان لێوەی وەرگرت، وە دەری خست و الجهمية پاڵ ئەدرێن بۆ لای ئەو، ئەوترێت الجعد ئەم وتەیەی لە أبان بن سمعان وەرگرتووە، أبان یش لە طالوت ی وەرگرتووە، طالوت یش لە لبيد بن الأعصم ی یەهودی خاڵی وەریگرتووە کە سیحری لە رسول الله کرد، الجعد بن درهم لە ئەهلی حەڕانە کە تیایدا خەڵکانێکی زۆری لە صابیئە و فەلاسیفەکان هەبوو، وە پاشماوەی ئەهلی دینی نەمرود، وە کەنعانیەکانیش، صابیئیەکان کەمێکیان نەبێت هەموویان لەسەر شیرک بوون و زاناکانیشیان فەلاسیفە بوون، الجعد فەلسەفەی لە صابیئیەکان وەرگرت، وە بەم شێوەیەش الفارابي چووە حەڕانەوە و فەلاسیفەی صابیئیەکانی بە تەواوی وەرگرت، وە الجهم یش کاتێک مونازەڕەی کرد لەگەڵ سۆمەنیەکان کە فەلاسیفەی هیند بوون وتەکانیانی وەرگرت، وە ئەوانە بوون کە نکۆڵی هەموو عیلمێکیان ئەکرد جگە لە الحسيات - الحسيات واتە ئەو شتانەی ٥ هەستەکەی ئینسان ئەتوانن پەی پێ ببەن - ، ئەمە سەنەدی جهم ە کە ئەگەڕێتەوە بۆ یەهود و صابیئە و موشریکین و فەلاسیفە گومڕاکان کە یان لە صابیئەن یان لە موشریکینن، دواتر کاتێک کتێبەکانی ڕۆم و یۆنان کران بە عەرەبی لە دەوروبەری سەدەی دووەم - سەدەی دووەم لە ١٠١ ه تا ٢٠٠ ه - ئەم بەڵایە زیادی کرد لەگەڵ ئەوەی شەیطان هەڵیدایە دڵی گومڕاکانەوە لەو

جۆرەی کە هەڵدرایە دڵی هاوشێوەکانیان، لە دەوروبەری سەدەی سێیەم - سەدەی سێیەم لە ٢٠١ ھ تا ٣٠٠ ھ - ئەم وتەیە بڵاوبووەوە کە سەلەف ناونیان لێنابوو الجهمية بە هۆکاری بشر بن غياث المريسي و چینەکەی، **ئەگەر بنچینەی ئەم وتەیە وەرگیرابێت لە خوێندکارانی موشریکین و صابیئە و یەهود ئیتر چۆن نەفسی ئیماندار ئاسوودە ئەبێت کە ڕێگای ئەوانە بگرێتە بەر کە تورەییان لەسەرە و گومڕا بوون وە وازلە ڕێگای ئەوانە بێنێت کە الله نیعمەتی بەسەردا باراندوون لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان؟)** .

بزانە بنچینەکانی ئەهلی تەعطیل لە جەهمی و موعتەزیلە و کوللابی و ئەشاعیرە و ماتوریدیەکان لعنهم الله لە نەفی کردنی حەقیقەتی صیفەتەکانی پەروەردگار و لابردنی لەسەر ڕووکەشەی زۆر زۆرن، ئێمەش باسی گرنگترین ئەو بنچینانە ئەکەین کە لە کتێب و تەفسیر و شەرحی حەدیثەکانیاندا هەیە، ئەوانیش :

١ - پێشخستنی عەقڵ بەسەر نەقڵ .

٢ - تانەدان لە جێگیری هەواڵەکانی صیفات بەوەی کە آحاد عیلمی لێوەرناگیرێت .

**٣** - تانەدان لە دەلالەتی دەقەکانی صیفات بەوەی دەلالەتێکی ڕووکەشین و یەقین نابەخشن .

**٤** - حەمل کردنی دەقەکانی صیفات لەسەر مەجاز .

ابن قیم (**٧٥١** ھ) دەربارەی ئەم **٤** بنچینە گڵاوە لە **(الصواعق المرسلة ٦٣٢/٢)** ئەڵێ :

**(ئەم چوار طاغوتە ئەوەی کردیان بە ئیسلام کردیان، ئاسەوارەکانیان سڕیەوە، نیشانەکانیان لابرد، بنچینەکانیان ڕووخاند، وە حورمەتی دەقەکانیان لە دڵەکاندا خست، وە ڕێگای تانەدانیان کردەوە بۆ هەموو زەندیق و مولحیدێک، هیچ کەسێک بەڵگەی نەهێناوەتەوە لە کیتابی الله یان سوننەتی رسول ـەکەی ئیللا ڕووی کردووەتە طاغوتێک لەم طاغوتانە، وە دەستی پێوە گرتووە، وەک قەڵغانێک گرتوویەتی بۆ ئەوەی لە ڕێگای الله لابدات، وە الله تعالی بە توانا و هێز و منەت و فەزڵەکەی دانە بە دانەی ئەم طاغوتانەی شکاند لەسەر زمانی خەلیفەکانی رسول ـەکەی، وە میراتگرانی پێغەمبەرەکانی، تا ئێستاش پشتیوانانی الله و رسول ـەکەی هاوار ئەکەن لەسەر ئەهلەکەی لەمسەر و ئەوسەری زەوی، وە ڕەجمیان ئەکەن بە نەیزەکەکانی وەحی، وە بە بەڵگەی عەقڵی) .**

## بنچینەی یەكەم : پێشخستنی عەقڵ بەسەر نەقڵ

لە گەورەترین بنچینەكانی موعەطیلەكان وەک جەهمی و موعتەزیلە و كوللابی و ئەشعەری و ماتوریدیەكان لعنهم الله پشتگوێ خستنی كیتابی الله و سوننەتی پێغەمبەرەكەیەتی و ڕووكردنیانە بۆ لای هەوا و ئارەزوو و عەقڵە فاسدەكانیان، كردوویانە بە سەرچاوەی هیدایەتیان، وە لە كاتی ڕاجیاوازیدا بۆی ئەگەڕێنەوە، وە بانگەشەی ئەوە ئەكەن دەقەكانی وەحی شوێنكەوتەی ئەون، كاتێک عەقڵیان بگات بە شتێک وەصفی الله تعالی ی پێ بكەن ئەوا جێگیری ئەكەن، بانگەشەی ئەوە ئەكەن ئەم صیفەتە كەمالە، پێویستە جێگیر بكرێت، دوورن لەوەی سەیری شەرع بكەن بزانن ئایا جێگیری كردووە یان نەیكردووە، وە كاتێكیش عەقڵیان نەگات بە شتێک وەصفی الله تعالی ی پێ بكەن ئەوا نەفی ئەكەن، بانگەشەی ئەوە ئەكەن ئەم صیفەتە كەموكوڕیە، پێویستە نەفی بكرێت، ئەگەرچی جێگیریش كرابێت بە دەقی قورئان و سوننەت، لوتكەی جێگیركردن و نەفی كردن لای ئەوان ئەوەیە كە عەقڵە فاسدەكەیان وەحییان بۆ ئەكات، نەک ئەوەی لەسەر نەقڵێكی صەحیحی ڕاشكاو بێت، لە دانراو و كتێبەكانیاندا زۆر بەڕوونی ئەمە بەدی ئەكرێت .

چەند نمونەیەکی کەم لە وتەکانیان لەم بارەیەوە :

١ - ابن فورك **الأشعري الجهمي** (٤٠٦ ﻫ) کتێبێکی داناوە بەناوی **(مشكل الحديث وبيانه)** کە تێیدا تەئویلی فەرمووودەکانی صیفات ئەکات بەبیانووی ئەوەی دژی عەقڵن .

٢ - أبو المعالي الجويني **الأشعري الجهمي** (٤٧٨ ﻫ) ئەڵێ : ئەگەر بەڵگەیەکی بیستراو پێچەوانەی عەقڵ بێت، ئەوە ڕەتکراوەیە بە تەواوی .

٣ - الغزالي **الأشعري الجهمي** (٥٠٥ ﻫ)کتێبێکی داناوە بە ناوی **(قانون التأويل)** کە تێیدا پیشانی داوە تاقمی حەق لە دەروازەکانی تەئویل ئەوانەن کە عەقڵیان پێش ئەخەن لە کاتی پێکدادانیان لەگەڵ نەقڵدا.

٤ - الزمخشري **المعتزلي** (٥٣٨ ﻫ) ئەڵێ : لە دینەکەتدا بچۆ ژێر ئاڵای سوڵتان، باوەڕ مەکە بە ڕیوایەتی لە فلان و لە فلان .

---

: لێرە عەقڵ بە سوڵتان ناوئەبات لعنه الله .

٥ - ابن العربي **الأشعري الجهمي** (٥٤٣ ﻫ) تەلەبەی الغزالي کتێبێکی داناوە بەناوی **(قانون التأويل)** تیایدا داناوە وەک شێخەکەی، ئەوەشی کە هەندێک صیفەتی جێگیر کردووە ئەوە لە ڕێگەی عەقڵەوە بووە نەک نەقڵ .

٦ - فخر الرازي **الأشعري الجهمي** (**٦٠٦** هـ) ئەڵێ : عەقڵ بنچینەی نەقڵە، کاتێک نەقڵ هات بە شتێک کە پێچەوانەی داواکاریەکانی عەقڵە، ئەوە عەقڵ پێش ئەخەین .

٧ - السنوسي **الأشعري الجهمي** (**٨٩٥** هـ ) لە (شرح الكبرى) ئەڵێ : بنچینەکانی کوفر شەش دانەن :

شەشەمیان بریتیە لە : دەستگرتن بە بنچینەکانی بیروباوەڕ بە تەنها لەسەر ڕووکەشی کیتاب و سوننەت بەبێ ڕێنمایی عەقڵ .

---

**: ئەوەی ئەم ئەشعەریە جەهمیە بە کوفری دائەنێت بریتیە لە عەقیدەی هەموو سەلەف رحمهم الله .**

٨ - محمد رشید رضا (**١٣٥٤** هـ) ئەڵێ : (بەڵگەی عەقڵی بیانوبڕ کاتێک لە ڕووکەشی شەرعدا شتێک هات پێچەوانەی کرد، کار بە بەڵگە عەقڵیەکە تایبەتەکە ئەکرێت، وە بۆ نەقڵ تەئویل و تەفویضمان هەیە، ئەم بابەتەش باسکراوە لە کتێبەکانی بیروباوەڕ کە ئەخوێندرێت لە ئەزهەر و جگە ئەوێش).

چەند وتەیەک لە ڕەددی ئەم بنچینە گڵاوە :

١ - ئیمامی **الشافعي** رحمه الله (**٢٠٤** ه) پرسیاری لێکراوە دەربارەی صیفەتەکانی الله تعالی، چی پێویستە، باوەڕمان بەچی بێت؟

وتی : الله تعالی ناو و صیفەتانێکی هەیە کە **کتێبەکەی پێوەی هاتووە**، وە **پێغەمبەرەکەی هەواڵی داوە** بە ئوممەتەکەی پێی، بۆ هیچ کەسێک لە درووستکراوەکانی الله تعالی نیە بەڵگەی پێ بگات و ڕەتی بکاتەوە، لەبەرئەوەی قوڕئان پێوەی دابەزیوە، وە بە درووستێتی لە رسول الله ـەوە کە قسەی پێکردووە، **هەرکەس پێچەوانەی ئەوە بکات دوای گەشتنی بەڵگە پێی ئەوا کافرە بە الله تعالی**، ئەمما پێش گەشتنی بەڵگە پێی لە ڕووی هەواڵپێدانەوە ئەوە عوزی هەیە بە نەزانین، **لەبەر ئەوەی عیلمی ئەوە نە بە عەقڵ درک ئەکرێت، نە بە بینین و بیرلێکردنەوەش** .

**(ذم التأويل (ص ١٣)، طبقات الحنابلة : (٢٦٩/٢)**

---

: بزانە ڕەحمەتی الله ـت لێ بێت صیفەتەکانی الله تعالی هەنێکیان بەبێ گەشتنی دەقی قوڕئان و سوننەت بە هەموو کەسێک ئەوا کەسەکان بە فیطرەتی خۆیان ئەزانن الله ئەژی و لەسەرەوەیە و عیلمی هەیە و هێزی هەیە و ئەبینێت و ئەبیستێت بۆیە پێش گەشتنی قوڕئان و سوننەتیش نکۆڵی یەکێک لەو صیفەتانە بکات کافرە و عوزر بە جەهلی بۆ نیە، بەڵام هەموو کەسێک بە فیطرەت نازانێت الله تعالی دەستی هەیە و پێی هەیە و پێ ئەکەنێت و تووڕە ئەبێت ئیللا لە ڕێگەی گەشتنی دەقی قوڕئان و سوننەتەوە نەبێت پێی، جا ئەگەرپێش گەشتنی دەقێکی

قورئان یان سوننەت ئەو صیفەتانەی جێگیر نەکرد ئەوا تەکفیر ناکرێت و عوزر بە جەهلی بۆ هەیە بەڵام دوای گەشتنی قورئان و سوننەت نکۆڵی بکات و جێگیری نەکات لەسەر ئەو شێوەیەی شایستەیە بە الله تعالی ئەوا کافرە و مورتەدە و عوزر بە جەهلی بۆ نیە چونکە بەڵگەی پێگەشتووە، والله تعالی أعلم .

٢ - ئیمامی **البربهاري** رحمه الله (**٣٢٩** هـ) ئەڵێ :

(بزانە کە جەهمیەکان بەهیلاکدا چوون لەوەی بیریان کردەوە لە پەروەردگار و وتیان بۆچی؟ چۆن؟ وازیان لە ئەثەر هێنا، قیاسیان دانا، وە **دینیان قیاس کرد لەسەرڕای خۆیان**) .

**(شرح السنة : ٩٩)**

---

: ڕا و بۆچوون زادەی عەقڵە ئەگین کەسێک صیفەتێکی الله تعالی ی پێ بوترێ ناڵێت بۆچی و چۆن چونکە ئەو کەسەی ئەڵێت بۆچی و چۆن ئەوە عەقڵی صیفەتەکە قبوڵ ناکات بۆیە پێش نەقڵی ئەخات و ڕەتی ئەکاتەوە تەسلیمی قورئان و فەرموودە نابێت .

٣ - **السجزي** (**٤٤٤** هـ) ئەڵێ :

(ئەمما پێشەوایانی گومڕا لە موشریکین، وە بانگەوازکارانی پەروەردگارێتی، وە مونافیقان، دواتر هەموو ئەوانەی لە ئیسلامدا داهێنراوێکیان داهێناوە، وە

ڕێگایان داناوە بە پێچەوانەی حەدیث، وە کاری بیروباوەڕەکانیان ڕەتکردەوە بۆلای عەقڵیات، وە نەزانراوە لە شێخەکانیانەوە بە شوێنکەوتنیان بۆئەثەر، وە سوننەتیان لە ئەهلەکەی وەرنەگرت، یان وەریان گرت و دواتر پێچەوانەیان کردن).

(رسالة في الحرف والصوت : ٢١٦)

٤ - السمعاني (٤٨٩ هـ) ئەڵێ :

(بزانە جیاکەرەوەی نێوان ئێمە و نێوان موبتەدیعەکان بابەتی عەقڵە، لەبەرئەوەی ئەوان دینەکەیان دامەزراندووە لەسەر عەقڵ، ئەمما ئەهلی سوننە ئەڵێن بنچینە شوێنکەوتنە، وە عەقڵەکانیش شوێنکەوتەن، ئەگەر بێتو دین لەسەر عەقڵ بنیات بنرایە درووستکراوەکان بێ نیاز ئەبوون لە وەحی، وە لە پێغەمبەرەکان صلوات الله علیهم، وە مانای ئەمرو نەهی باطل ئەبووەوە، هەرکەس هەرچی بوویستایە ئەیوت) .

(الانتصار لأصحاب الحديث ص : ٨١)

٥ - ابن قيم (٧٥١ هـ) ئەڵێ :

(دژایەتی فەرمانی پێغەمبەران بە مەعقولات بریتیە لە ڕێگای کافرەکان، ئەوانە سەلەفن بۆ خەلەفی دوای خۆیان، خراپترین سەلەف، وە خراپترین خەلەف، وە هەرکەس وردبێتەوە لە دژایەتی موشریکین و کافران بۆ پێغەمبەران بە عەقڵیان، ئەوا دژایەتی بەهێزتر ئەبینێت لە دژایەتی جەهمی

و نەفیکەرانی ئەو هەواڵانەی دەربارەی الله و صیفەتەکانی و بڵندێتیەکەی لەسەردرووستکراوەکانی و قسەکردنەکەی بۆ فریشتەکانی و پێغەمبەرانی بە عەقڵیان) .

(الصواعق المرسلة على الجهمية والمعطلة : ٨٩٨/٣)

## بنچینەی دووەم : تانەدان لە جێگیری هەواڵەکانی صیفات بەوەی کە آحاد عیلمی لێوەرناگیرێت

لە طاغوتەکانی ئەهلی تەعطیل بۆ ڕەتکردنەوەی ئەو دەقانەی دەربارەی صیفەتەکانی الله تعالی هاتوون ڕەتکردنەوەی فەرموودەکانی آحاد ـە، لەبەرئەوەی لای ئەوان جێگیرێتیەکانیان گوماناویە، وە وازیان هێناوە لەوەی بەڵگەی پێ بهێننەوە لە بابەتەکاتی بیروباوەڕ، ئەهلی بیدەع بەم گومانە شەیطانیە زۆرێک لە سوننەت و ئەثەرە صەحیحەکانیان ڕەتکردۆتەوە کە دەربارەی صیفەتەکانی پەروەردگار و بینینی و شەفاعەتەوە هاتوون .

بە سادەیی بۆ ئەوەی تێ بگەیت مەبەست لە فەرموودەی آحاد چیە، فەرموودەی آحاد ئەو فەرموودەیە لە هەر چینێک لە چینەکان کە فەرموودەکەیان ڕیوایەت کردووە لە یەک کەس یان دوو کەس یان سێ کەس زیاتر نەبن و نەگاتە پلەی تواتر، بۆ نمونە لە هاوەڵان تەنها دوو کەس فەرموودەیەک لە رسول الله ئەبیستن و ڕیوایەتی ئەکەن، دواتر دوو تابعین یش لەو دوو هاوەڵەی ڕیوایەت ئەکەن، دواتر دوو تابعی تابعین لەو دوو تابعینەی ڕیوایەت ئەکەن، بەو جۆرە تا دێتە سەردەمی البخاري و مسلم و ئەوانی تر کەمترین کەس ئەم فەرموودەی ڕیوایەت کردووە بۆیە پێی ئەوترێت آحاد،

تەبعەن تا پێش دەركەوتنی موعتەزیلە لعنهم اللە كەس ئەم جیاكاریەی نەكردووە بڵێت مادام ئەوە آحادە وەرناگیرێت .

چەند نمونەیەكی كەم لە وتەكانیان لەم بارەیەوە :

١ - الخطابي **الأشعري الجهمي** (**٣٨٨** هـ) ئەڵێ : (مادام لە كیتاب باس نەكرابێت، وە لە تواتر دا نەبێت، وە لە كیتابدا مانایەک نەبێت پەیوەست پێوەی، هاتبێت لەسەر ڕێگای آحادەوە، وە ئەم وتەیە بمانبات بۆ تەشبیه ئەگەر لەسەر ڕووكەشەی وەرمانگرت، ئەوا ئێمە تەئویلی ئەكەین لەسەر مانایەک كەلام هەڵی بگرێت وە مانای تەشبیهەكەش لاببات لەگەڵیدا) .

**(الأسماء والصفات للبيهقي)**

٢ - البیهقي **الأشعري الجهمي** (**٤٥٨** هـ) ئەڵێ : (هاوەڵانمان لە ئەهلی وردبوونەوە وازیان هێناوە لە بەڵگەهێنانەوە بە هەواڵەكانی آحاد دەربارەی صیفەتەكانی اللە تعالی ئەگەر لەوەی بە تەنها پێوەی هاتووە لە كیتاب و ئیجماعدا بنچینەیەكی نەبێت، وە سەرقاڵ بوون بە تەئویل كردنی) .

**(الأسماء والصفات للبيهقي)**

---

**: ئەم دوو جەهمیە درۆزنە درۆ ئەكەن، چونكە لێرە ئەڵێن ئەگەر فەرموودەی بواری سیفات آحاد بێت تەئویلیان كردووە، بەڵام لەڕاستیدا خۆیان و جەهمیەكانی تریش**

قورئانیان تەحریف کردووە، وە چەندین فەرموودەی صحیح و صریح یان تەحریف کردووە کە لە چەندین ڕێگەوە ڕیوایەت کراوە و متواتربووە، هۆکارەکەش بریتی نییە لە آحاد بوون یان متواتربوون ی فەرموودەکە، چونکە وەکو وتمان ئەمانە تەنانەت قورئانیش تەحریف ئەکەن، هۆکاری سەرەکی کافربوونی ئەم جەهمیانە بە قورئان و فەرموودە ئەوەیە کە مانای ڕووکەش و حەقیقی قورئان فەرموودە بە تەشبیه و کوفر و زەندەقە ئەزانن، ئەگەر کەسێکیش الله تعالی و پێغەمبەرەکەی ﷺ بەڕاست بخاتەوە و ڕووکەشی قورئان و فەرموودە وەربگرێت بە کافر و موجەسیمە و موشەبیهەی ئەزانن، لەکاتێکدا وەرگرتنی مانای ڕووکەشی قورئان و فەرموودە مەنهەجی هەموو سەلەفە رحمهم الله تعالی .

٣ - الجويني **الأشعري الجهمي** (**٤٧٨** هـ) ئەڵێ : (لە پێشدا وتمان کە هەواڵە آحاد ەکان لە بابەتە بیانوبڕەکان سەرناگرێت) .

**(الشامل في أصول الدين)**

٤ - فخر الرازي **الأشعري الجهمي** (**٦٠٦** هـ) ئەڵێ : (ئەمما دەستگرتن بە هەواڵێکی تەنهاوە - آحاد - دەربارەی ناسینی الله درووست نیە) .

**(أساس التقديس)**

---

: ئەم جەهمیە بێشەرمە ڕۆیشتووە لە زبڵخانەی کەلام و فەلسەفەی یۆنان ئەنواع یاسای کوفری بۆ سیفەتەکانی الله تعالی داتاشیوە کەچی لەملاوە دێت ئەڵێت کار بە فەرموودەی آحاد ناکرێت بۆ ناسینی الله تعالی! الله تعالی لە ئەفلاتون و ئەرستۆی ئیمامی حەشری بکات .

نمونە بۆ قبوڵکردنی هەواڵی آحاد و وەرگرتنی عیلم و دڵنیایی لێوەی لەلایەن ئەهلی عیلمەوە زۆرە، چەند نمونەیەکی کەم لەوەش :

١ - **عباد بن العوام** رحمه الله ئەڵێ :

(شريك (١٧٧ هـ) گەشتە لامان، پرسیارمان لێکرد دەربارەی فەرموودەی : (الله دائەبەزێت لە شەوی نیوەی شەعباندا) وتمان کەسانێک هەن نکۆڵی ئەم فەرموودانە ئەکەن .

وتی : چی ئەڵێن؟

وتمان : تانەی لێ ئەدەن .

وتی : ئەوانەی بەم فەرموودانەوە هاتوون هەر ئەوانەن کە بە قورئانەوە هاتوون، وە بە پێنج نوێژەکەوە، وە بە حەجکردنی کەعبەوە، وە بە ڕۆژووگرتنی ڕەمەزانەوە، الله ناناسین ئیللا بەو فەرموودانە نەبێت .

لە دەربڕینێکی تردا ئەڵێ: ئێمە دینەکەمان لە تابعینەوە لە هاوەڵانی رسول الله ـەوە وەرگرتووە، ئەی ئەوان لە کێ وەریان گرتووە؟

**(السنة لعبدالله : ٤٩٣ و ٤٩٤)**

---

**: والله أعلم مەبەستی ئەوەیە ئەگەر تۆ تانە بدەیت لە فەرموودەیەک دەربارەی صیفەتەکانی الله تعالى بەوەی آحاد ە و ڕەتی بکەیتەوە ئەبێت نوێژو ڕۆژووو حەج و زەکات و جیهاد و باقی بابەتەکانی تریش ئەگەر بە فەرموودەی آحاد هاتبن ڕەتیان بکەیتەوە .**

٢ - ئیمامی **الشافعي** رحمه الله (**٢٠٤** هـ) ئەڵێ :

**(حیفظم نەكردووە لە فەقیهەكانی موسڵمانانەوە كە ڕاجیاوازبووبن لە جێگیركردنی هەواڵی آحاد) .**

**(الرسالة : ٤٥٧/١)**

---

**: واتە هەموو سەلەف رحمهم الله خەبەری آحاد لەلایەن جێگیربووە ووەكو جەهمیەكان ڕەتیان نەكردووەتەوە .**

٣ - **أبوبكر المروزي** رحمه الله ئەڵێ :

بە أبي عبدالله م وت - واته الإمام أحمد ٢٤١ هـ - لێرە ئینسانێک هەیە كە ئەڵێ هەواڵی آحاد كردار واجب ئەكات بەڵام عیلم واجب ناكات .

**عەیبداری كرد وە وتی : نازانم ئەمە چیە !**

**(المسودة في أصول الفقه ص : ٢١٨)**

---

**: ئەو كەسە لعنه الله لەو قسەی مەبەستی ئەوە بووە هەواڵێكی آحاد نوێژ و ڕۆژوو و زەكات و باقی كردارەكانی تر واجب ئەكەن بەڵام صیفەتەكانی الله تعالی و باسی فریشتەكان و قیامەت وبەرزەخ وباقی بابەتە غەیبیەكان واجب ناكەن، لەبەرئەوەی جەهمیەكان لە بابەتی سیفاتەكانی الله تعالی قورئان و فەرموودەیان فڕێ داوە و جەهلی كەلام و المنطق و عەقڵە پووچەكەی خۆیان پێش ئەخەن بەسەریدا .**

٤ - ابن تيمية (٧٢٨ هـ) ئەڵێ :

(ئەوەی سەلەفی ئوممەت و پێشەوایانی ئیسلام لەسەری کۆکن ئەوەیە هەواڵی صەحیح قبوڵکراوە و بە ڕاست دانراوە لە هەموو دەروازەکانی عیلمدا، جیاوازی نەکراوە لە نێوان بابەتە عیلمی و خەبەریەکان، وە هەواڵێک لە دەروازەیەک لە دەروازەکان یەکسانە کە لە أصول - عەقیدە - یان فروع - فیقهـ و سیرە و بابەتەکانی تر - ڕەتنەکراوەتەوە بەهۆی ئەوەی هەواڵێکی تاک - آحاد - بووبێت، ئەمە لە داهێنراوی ئەهلی بیدەعە کە پێچەوانەی سوننەت و جەماعەتن) .

(الجواب الاعتراضات المصرية ص : ٥٠)

---

: لەلای بەشێک جەهمیەکان فەرموودەی آحاد لە بابەتی فیقهیدا کاری پێ ئەکرێت، بەڵام لە بابەتی عەقیدەدا کاری پێ ناکرێت، بەهۆی ئەوەی لەو بابەتانەدا عەقڵی پووچی خۆیان و جەهلی کەلام و فەلسەفەی یۆنان پێش ئەخەن بەسەر وتەی الله تعالی و پێغەمبەرەکەی ﷺ، ئەمە بیانوویەکە جەهمیەکان بەکاری ئەهێنن بۆ ڕەتکردنەوەی عەقیدەی موسوڵمانان، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر فەرموودەکە آحاد نەبێت و لە چەندین ڕێگەشەوە گێڕدرابێتەوە مانای فەرموودەکە ئەگۆڕن و تەحریفی ئەکەن ئینجا وەری ئەگرن، و اتە لە هەردوو حاڵەتەکەدا شوێن هەوا و ئارەزووی پیسی خۆیان ئەکەون، ئەمانە قورئان تەحریف ئەکەن چجای بگات بە فەرموودەی آحاد !

**٥** - ابن قیم (**٧٥١** ه) دەربارەی جیاکاری لە نێوان قبوڵکردنی هەواڵەکان لە نێوان بیروباوەڕ و کردارەکاندا قسە ئەکات و ئەڵێ :

**(ئەم جیاکاریە باطلە بە کۆدەنگی ئوممەت، لەبەرئەوەی بەردەوام و تا ئێستاش هاوەڵان و تابعین و ئەوانەشی شوێنیان کەوتوون لە ئەهلی حەدیث و سوننە بەڵگە بەم هەواڵانە - هەواڵە آحاد ەکان - ئەهێننەوە لە بابەتەکانی صیفات و قەدەر و ناو و حوکمەکان) .**

**(الصواعق المرسلة على الجهمية والمعطلة)**

## بنچینەی سێیەم : تانەدان لە دەلالەتی دەقەکانی صیفات بەوەی دەلالەتێکی ڕووکەشین و یەقین نابەخشن

هەموو صیفەتەکان لە کیتابی الله باس کراون وە جێگیربوون بە ڕێگایەکی صحیح لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ، ئەمانە کەسیان گومانی نیە لە جێگیربوونیان، ناتوانن ڕەتی بکەنەوە لە ڕوانگەی قبوڵ کردنەوە، لە ڕووکەشدا وا پیشانی ئەدەن قبوڵی ئەکەن بەڵام دواتر حەقیقەتەکەی بەتاڵ ئەکەنەوە بەوەی تانە ئەدەن لە ماناکەی بەوەی تەنها لەفزێکە و عیلم نابەخشێت، وە یەقین نادات بۆیە ڕوو ئەکەن یەکێک لەم دووانە یان تەئویل یان تەفویض، هەر لەبەر ئەم هۆکارەی و چەندین هۆکاری ترە کە جەهمیەکان باوەڕیان بە خودی قورئان و فەرموودە نییە و کافرن پێی، بەڵکو باوەڕیان بەو ڕا و بۆچوونە هەیە کە خۆیان هەیانە بۆ قورئان و فەرموودە .

وە هەروەها ئەڵێن ڕووکەشی دەقەکانی صیفەتەکانی الله تعالى بەرەو تەشبیه ئەڕۆن، وە ڕووکەشەکەی مەبەست نیە لای الله تعالى، بەڵکو مەبەستەکە شتێکی ترە دوور لە ڕووکەشەکەی، بە حسابی خۆیان بۆ پاکڕاگرتنی الله لەو تەشبیهەی کە دەقەکە هەیەتی ڕا ئەکەن بۆ دوو ڕێگا یان

تەئویل یان تەفویض، بەڵام لەڕاستیدا سیفەتەکانی الله تعالی پەک ئەخەن و الله تعالی و پێغەمبەرەکەی ﷺ بەدرۆ ئەخەنەوە .

چەند نمونەیەکی کەم لە وتەکانیان لەم بارەیەوە :

١ - البیهقي **الأشعري الجهمي** (**٤٥٨** هـ) دەربارەی هەڵوێستی ئەشاعیرە لە ئایەت و حەدیثەکانی صیفات قسە ئەکات و ئەڵێ :

**أ)** تیایانایە قبوڵی کردووە و ئیمانی پێهێناوە و تەئویلی نەکردووە و **عیلمەکەی بردۆتەوە بۆ لای الله** و نەفی چۆنێتی و تەشبیهی کردووە.

**ب)** وە تیایانایە قبوڵی کردووە و ئیمانی پێهێناوە و حەملی کردووەتە سەر ڕوویەک کە درووستە بەکار بێت لە زماندا و **تەوحید هەڵناوەشێنێت** .

**(الاعتقاد ص : ١٢٠)**

---

**: لەوانەیە کەسێکی نەزان کاتێک وتەکەی ئەم جەهمیە ئەبیستێت بڵێت وتەکەی جوانە، بەڵام لەڕاستیدا هەردوو ئەو خاڵانەی باسیان ئەکات جەهمیەت و کوفرن، چونکە لە خاڵی یەکەمدا ئەڵێت (علیمەکەیان بردووەتەوە بۆ لای الله)، تەفویضیان کردووە، واتە ئەڵێن ئێمە نازانین ئەم ئایەت و فەرموودەیانەی سیفات واتایان چییە! لەکاتێکدا هەموو کەسێکی موسوڵمان ئەزانێت کاتێک الله تعالی ئەفەرمووێت : | ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ | واتە لەسەرعەرشە .**

پرسیارلە یزید بن هارون ئەکەن جەهمیەکان کێن؟

ئەڵێت : هەرکەسێک پێی و ابێت | ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ | بە پێچەو انەی ئەوەیە کە لە دڵی خەڵکی عەوام جێگیربووە ئەوا ئەوکەسە جەهمیە.

## السنة لعبدالله بن الإمام أحمد

: لەلای سەلەف تەنانەت خەڵکە عەوامە ئاساییەکەش ئەزانن مانای ئەو ئایاتە ئەوەیە الله تعالى لەسەرعەرشە، بەڵام ئەشعەریە جەهمیەکان نازانن و اتای چییە! نەخێر هۆکاری سەرەکی نەزانینی و اتاکەی نییە، بەڵکو و اتاکەی زۆر بە باشی ئەزانن بەڵام پێیان وایە ئەو مانایە کوفرو تەشبیهە پەنا بە الله تعالى، هەربۆیە خۆیان ئەدزنەوە لە جێگیرکردنی مانای ڕووکەشی ئایاتەکان .

وە لە خاڵی دووەمدا ئەڵێت (ئیمانیان پێ هێناوە بەڵام و اتاکەیان گۆڕیوە بە و اتایەک کە تەوحید هەڵنەوەشێنێتەوە)!

ئاخر ئەمە چ ئیمان پێهێنانێکە و اتاکەی بگۆڕیت ئینجا ئیمانی پێ بهێنیت! خۆ هەموو کەسێکی کافرو زەندیق ئەتوانێت بێت بڵێت من باوەڕم هەیە بە فڵانە و فڵانە شتی ئیسلام و لەگەڵیدا و اتاکەی بگۆڕێت، بۆ نمونە زەندیقەکە ئەڵێت و اتای ئەوەی لەگەڵ کافران شەڕ بکەن بە شمشێر و اتە بە قەڵەم شەڕیان لەگەڵ بکەن چونکە ئەمڕۆ قەڵەم وەکو شمشێر وایە، دواتر لەم ڕێگەیەوە پایەی جیهاد ڕەتئەکاتەوە، ئەمە چ جۆرە قبووڵ کردن و ئیمان پێهێنانێکە مانای ڕاستی و ڕووکەشی ئایەتەکە بە هەڵوەشێنەرەوەی تەوحید بز انیت و و اتاکی بگۆڕیت بە شێوەیەک لەگەڵ جەهلی کەلامدا بگونجێت؟ بەڵکو ئەمە بەدرۆخستنەوەی الله تعالى و کافربوونە بە سیفاتەکانی، وە تەحریفکردنی قورئان و فەرموودەیە بەگوێرەی هەوا و ئارەزووو ڕا و بۆچوونی کوفری .

**٢** - فخر الرازي **الأشعري الجهمي** (**٦٠٦** هـ) ئەڵێ :

ڕووکەشە نەقڵیەکان ئەگەر خرانە بەر بەڵگە عەقڵیەکان نەیتوانی بەڕاستی بخاتەوە وە نەیتوانی بەدرۆی بخاتەوە، بۆ ڕێگری کردن لە کۆبوونەوەی ئەو دوو هەڵوەشێنەرەوە و بەرزبوونەوەیان، بەڕاستخستنەوەی نەقڵ و بەدرۆخستنەوەی عەقڵ نیە، لەبەر ئەوەی عەقڵ بنچینەی نەقڵە، بەدرۆخستنەوەی بەڕاستخستنەوەکەی بەدرۆخستنەوەیان واجب ئەکات، بەڕاستخستنەوەی عەقڵ :

**أ)** تەفویضی عیلمی نەقڵ بۆ لای اللە .

**ب)** خۆ سەرقاڵ کردن بە تەئویلی ڕووکەشەکان .

**(درء التعارض : ٣/٢٦)**

---

**: قسەکەی زۆر ڕوونە بۆ هەر کەسێک اللە تعالى هیدایەتی دابێت، واتە هەرکاتێک قورئان و فەرموودە لەگەڵ عەقڵە پووچەکەیدا نەگونجا یان ماناکەی ئەگۆڕێت و ئیمان بەو مانایە ئەهێنێت کە خۆی کردوویەتی بۆی و کافر ئەبێت بە مانای حەقیقی ئایەت و فەرموودەکان، یان ئەڵێت من هەرنازانم یەم ئایەت و فەرموودەیانە مانایان چییە بۆ ئەوەی خۆی لە جێگیرکردنی سیفەتەکانی اللە تعالى بدزێتەوە .**

٣ - النووي **الأشعري الجهمي** (**٦٧٦** هـ) ئەڵێ :

(ڕاجیاوازن - واتا ئەهلی کەلام - دەربارەی صیفات و هەواڵەکانی ئایا ئەچنە ناوی بە تەئویلەوە یان نا؟

هەنێک ئەڵێن تەئویل ئەکرێت لەسەر ئەو شێوەی شایستەیە پێی، وە ئەمە بەناوبانگترین مەزهەبی موتەکەلیمینە، وە هەنێکی تریان ئەڵێن تەئویل ناکرێت، بەڵکو بێدەنگ ئەبین لە قسەکردن لە واتاکەیدا، وە عیلمەکەی ئەبرێتەوە بۆ لای الله تعالی.

**(المجموع شرح المهذب : ٢٥/١)**

---

**: النووي القبوري الجهمي لعنه الله ئەم شتە زۆر دووبارە ئەکاتەوە بەدرێژایی شەرحەکەی بۆ صحیح ی ئیمامی مسلم رحمه الله رحمة واسعة .**

٤ - ابن حجر العسقلاني **الأشعري الجهمي** (**٨٥٢** هـ) ئەڵێ :

(کاتێک هەواڵی باسکردنی صەوت - صەوتی الله تعالی کاتێک قسە ئەفەرموێت - جێگیر بوو بەم هەواڵە صەحیحانە، ئیمان پێهێنانی واجب ئەبێت، **دواتریان تەئویل یان تەفویض)** .

**(فتح الباري : ٤٥٨/١٣)**

: سوێند بە الله هەر کەسێک الله تعالی چاوی دڵی کردبێتەوە بۆ حەق ئەزانێت ئەم قسەیەی ابن حجر الجهمي زۆر منداڵانەیە، یاعنی چی ئیمانت بە شتێک هەبێت بەڵام دواتر ماناکەی بگۆڕیت لەبەر ئەوەی پێت وایە مانای ڕووکەشەکەی کوفر و تەشبیهە! ئەمە چ ئیمان پێهێنانێکە! یان خۆت بدزیتەوە لە جێگیرکردنی مانای ڕووکەشەکەی و بڵێیت قبووڵمە بەڵام ڕووکەشەکەی مەبەست نییە و تفویض ی بکەیت!

ابن قیم (٧٥١ هـ) لە ڕەددی ئەم بنچینە گڵاوە لە (الصواعق المرسلة) ئەڵێ :

**(هەرکەس وردبێتەوە لەمە یان وێنای بکات بۆی ڕوون ئەبێتەوە کە وتەی وتەبێژ کە ئەڵێ : بەڵگە لەفزیەکان کە رسول الله پێوەی هاتووە عیلم و یەقین نابەخشن؛ ئەوە لە گەورەترین جۆرەکانی السفسطة یە، وە زۆرترین هۆکاری زەندەقەیە، وە ئەوانە خراپترن لە اللأدرية وە خراپترن لە باطنیەکان).**

: السفسطة ئەم مانایانە ئەدات : شتێک کە ڕووکەشەکەی حەقە و ناوەڕۆکەکەی باطلە، یان قیاسێک کە پێشەکیەکەی درووستە و ئەنجامەکەی درۆیە، یان بەڵگەهێنانەوەی هەڵە.

- اللاأدرية مولحیدەکانن کە ئەڵێن خوا بوونی نیە.

- الباطنية ئەوانەن کە ئەڵێن دەقەکان مانایەکی شاراوەیان هەیە کە کەس نایزانێت ئێمە نەبێت وەک ئیسماعیلی و قەڕامیطی و خیرەمیەکان أخزاهم الله .

وە هەروەها ئەڵێ :

(ئەوانەی ئەڵێن یەقین و عیلم دێتە جێ لە بەڵگە عەقڵیەکان نەک لە بەڵگە بیستراوەکان - قورئان و سوننەت - ئەوە ئەوانەن - فەلاسیفەکانن -، وە لەوانەوە ئەم بنچینەیان وەرگرتووە، ئەوە یەکێکە لە بنچینەکانی فەلسەفە و ئیلحاد و زەندەقە کە ئەوە لە **خۆئەگرێت دووربکەویتەوە لە پێغەمبەران و ئەوەی پێغەمبەران پێوەی هاتوون لەلایەن الله ەوە لە بەڵگە بیستراوەکان، وە سەرخستنی بنەما مەنطیقیەکان، وە ڕا و بۆچوونە فەلسەفیەکان، موتەئەخیرینی جەهمیەکان** - و اتە ئەشعەریەکان - **ئەمەیان لێوەرگرتن و زاڵیان کردن بەسەر ئەهلی کیتاب و سوننەت، وە موتەقەدیمینیان بە ڕاشکاوی ئەوەیان نەئەکرد، بەسەریدا نەئەپەڕینەوە، موتەئەخیرین ئەم دەمامکەیان لابرد، وە کردیان بەبەری دیندا، وە ڕاشکاو بوون لە دوورخستنەوەی وەحی لە پلەی خۆی و لە موسڵمانان، بانگەوازی ئەم فێڵ لێکراوی فێڵبازانە ئەوەیە ئەوەی پێغەمبەران پێوەی هاتوون یەقین نابەخشن**، وە ئەو قسە بێ مانایانەی کە بنیاتیان ناوە لەسەری و بەڵگەی پێ ئەهێننەوە کە یەقین ئەبەخشێت لە هەمان جۆری بانگەشەی فیرعەونە : | قَالَ فِرۡعَوۡنُ مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ | **(غافر: ٢٩)**

وە دەربارەی موسی و ئەوەی پێوەی هاتووە وتی : | إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمۡ أَوۡ أَن يُظۡهِرَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡفَسَادَ | **(غافر: ٢٦)**

## بنچینەی چوارەم : حەمل کردنی دەقەکانی صیفات لەسەر مەجاز

لە بنچینەکانی ئەهلی تەعطیل وەک جەهمی و موعتەزیلە و کوللابی و ئەشاعیرە و ماتوریدیەکان لعنهم الله بۆ نەفی کردنی حەقیقەتی صیفەتەکانی الله تعالی بانگەشەی ئەوەیانە کە دەقەکانی صیفەتەکانی الله تعالی حەمل ئەکرێتە سەر مەجاز، وە ئەوە یەکێکە لە طاغوتەکانیان کە نەفی حەقیقەتی صیفەتەکانی الله تعالی ی پێ ئەکەن، ئەمەش بۆ گۆڕین و تەحریفکردنی واتاکانی قورئان فەرموودەیە، چونکە ڕووکەشەکەی بە کوفر و هەڵوەشێنەرەوەی تەوحید ئەزانن .

چەند نمونەیەکی کەم لە وتەکانیان لەم بارەیەوە :

**١** - ابن الأثیر **الأشعري الجهمي** (**٦٣٠** هـ) ئەڵێ :

هەموو ئەوەی هاتووە لە قورئان و حەدیث لە زیادکردنی دەست و دەستەکان و ڕاست و جگە لەمانەش لە ناوی ئەندامەکان بۆ الله تعالی ئەوە لەسەر ڕێگای مەجازە، الله دوورە لە تەشبیه و تەجسیم .

**(النهاية في غريب الحديث : ٣٠٠/٥)**

---

**: ئەم جەهمیانە عەقیدەیان بە شێوەیەکە ئەگەر ئەوەی لە قورئان و فەرموودەدا دەربارەی سیفاتەکانی الله تعالی هاتووە جێگیری بکەیت و چۆنیەتی سیفەتەکە بگەڕێنیتەوە بۆلای الله تعالی ئەمە بە کوفر و تەشبیه ئەزانن، لەکاتێکدا ئەمە باوەڕبوونە بە کەلامی الله و وتەی رسول ـەکەی ﷺ و عەقیدەی هەموو سەلەف رحمهم الله .**

**٢** - القرطبي **الأشعري الجهمي** (**٦٥٦** ه) لە نەفی کردنی بڵندێتی الله تعالی بەسەر درووستکراوەکانیەوە لە کاتی شەرح کردنی حەدیثی جاریەکە کە پێغەمبەر پرسیاری لێ ئەکات (الله لەکوێیە؟) ئاماژە ئەکات بۆ ئاسمان ئەڵێ : (وە ئەگەر ئەمە جێگیر بوو، جێگیر ئەبێت کە پێغەمبەر ئەمەی بۆ ئاماژەپێدان لەسەر الله بە **مەجاز** داوە، لەبەر پێویستی تێگەیاندنی بەرامبەر کە تێگەشتنەکەی کورتبڕە).

**(المفهم شرح مسلم : ١٤٣/٢)**

---

**: ئەم جەهمیە لەبەر ئەوەی فەرموودەکەی رسول الله ی قبووڵ نییە و بە کوفر و تەشبیهی ئەزانێت ئەڵێت رسول الله مەبەستی لەوە نەبووە! ئەی بۆچی سەلەف هەمان فەرموودەیان لە کتێبەکانیاندا هێناوە بی جێگیرکردنی سیفەتی العلو و بڵندێتی الله تعالی؟ بۆچی ئەوان وەکو ئێوەی جەهمی نەیانئەوت مەجازە؟ ئەسڵەن سەلەف ئەم فەرموودەیەیان لە کتێبە عەقیدەکانیان دژی جەهمیەکی وەکو ئێوە هێناوە، لەبەرئەوەی سەلەف رحمهم الله**

ڕێزی وتەی الله ورسول ەکەیان ﷺ گرتووە وعەقیدەی خۆیان لەسەردامەزر اندووە وتەنها بەڵگەیان بووە و دژی کافر زەندیقەکان بەکاریان هێناوە، بەڵام ئێوە کافر بوون بە فەرموودەکەی رسول الله ﷺ و ئەزانن فەرموودەکە سەد لە سەد عەقیدەی کوفریە کەلامیەکەتان هەڵئەوەشێنێتەوە بۆیە ئەڵێت مەجازە .

٣ - العز بن عبدالسلام **الأشعري الجهمي** (٦٦٠ ھ) ئەڵێ :

(کاتێک وەصفی الباریٔ بکرێت بە شتێک لەوە درووست نیە وەصفی پێ بکرێت لە حەقیقەتدا لەبەر ئەوەی کەموکوڕیە بەڵکو وەصفی پێ ئەکرێت لەسەر **مەجاز**) .

**(الإشارات المجاز)**

٤ - النووي **الأشعري الجهمي** (٦٧٦ ھ) دەربارەی فەرموودەی (الله بیستی ڕانەگرتووە بۆ شتێک بەوێنەی ڕاگرتنی بیستنی بۆ پێغەمبەر کە قوڕئان ئەخوێنێت) ئەڵێ :

(زانایان ئەڵێن مانای ڕاگرتنی بیستن لە زماندا گوێ لێ گرتنە، ئەڵێن درووست نیە ئەمە حەمل بکرێتە سەر گوێ لێ گرتن بە واتای گوێ لێ گرتن بە ئاگاییەوە، لەبەر ئەوەی مەحاڵە لەسەر الله، **بەڵکو ئەوە مەجازە**، وە واتاکەی نزیکە لە نزیک کردنەوەی قوڕئان خوێنەکە و زیادکردنی پاداشتەکەی) .

(منهاج شرح مسلم بن حجاج : ٧٩٢)

---

: ئەم جەهمیە ئەڵێت (لەبەر ئەوەی مەحاڵە لەسەر الله)، بۆ مەحاڵە؟ مەگەر فەرموودەکە وا نافەرمووێت؟! بۆچی فەرموودەکە قبووڵ ناکەیت وەکو خۆی؟ بۆچی هەر ئەبێت کافر بیت بە مانای فەرموودەکە؟ بۆچی هەر هەبێت مانای فەرموودەکە بگۆڕیت و ئیمان بەوتەحریفاتە بهێنیت کە خۆت بۆفەرموودەکەت کردووە؟ لەبەرئەوەی عەقڵی پووچی خۆت و جەهلی کەلامت پێشخستووە بەسەرقورئان و فەرموودەدا و باوەڕت پێیان نییە ئیلا بەو شێوەیە نەبێت کە هەوا و ئارەزووت داوای ئەکات قبحک الله وأخزاک .

چەند وتەیەک لە ڕەددی ئەم بنچینە گڵاوە :

١ - ئیمامی **الكرجي القصاب** رحمە الله (**٣٦٠** ھ) ئەڵێ :

**(هەموو صیفەتێک الله نەفسی خۆی پێ وەصف کردبێت، یان رسولەکەی وەصفی پێ کردبێت، ئەوە صیفەتی مەجاز نیە، ئەگەر بێتو صیفەتی مەجازبوایە پێویستی ئەکرد تەئویل بکرێت، وە بوترێ مانای بینین ئەمەیە وە مانای بیستن ئەمەیە، وە تەفسیر بکرێت بە شتێک کە لە تێگەشتنەکان تێنەپەڕێت، ئەوا مەزهەبی سەلەف دانپێدانانیەتی بەبێ تەئویل، زانرا کە ئەوە حەمل ناکرێتە سەرمەجاز، بەڵکوحەقێکی ڕوونە .**

(السير : ٢١٣/١٦)

٢ - السجزي (٤٤٤ ﮬ) ئەڵێ :

**(پێویستە بزانرێت کە الله تعالی کاتێک وەصفی نەفسی خۆی کرد بە صیفەتێکی مەعقول لای عەرەب، وە قسەکردنێک پێوەی هاتووە بەوەی ئەیناسنەوە لە نێوانیان، وە الله پێچەوانەی ئەوەی عەقڵیان ئەیگرێت پیشانی نەداوە، وە پێغەمبەر تەفسیری نەکردووە بە تەفسیرێک پێچەوانەی ڕووکەشەکەی بێت، ئەوە لەسەر ئەوەیە کە عەقڵیان ئەیگرێت و ئەیناسنەوە.**

**(رسالة في الحرف والصوت : ١٥٢)**

---

**: (وەصفی نەفسی خۆی کرد بە صیفەتێکی مەعقول لای عەرەب) واتە الله تعالی وەسفی خۆی کردووە بە هەندێک وەسف کە عەرەب لێی تێئەگەن، وە رسول الله ﷺ کاتێک فەرموودەکەی گێڕاوەتەوە هەر وەکو خۆی گێڕاویەتیەوە و تەئویلی نەکردووە، کەواتە ئەم جەهمیانە بۆ دێن تەحریفی قورئان و فەرموودە ئەکەن؟ چونکە کافرن پێی و قبووڵیان نییە ئیللا بەو شێوەیە نەبێت کە هەوا و ئارەزوو و عەقڵی پووچی خۆیان و جەهلی کەلام داوای ئەکات .**

٣ - أبو القاسم التيمي (٥٣٥ ﮬ) ئەڵێ :

**(وە بەڵگەیەکی تر ئەوەیە کە هەرکەس لەفزەکە حەمل بکاتە سەر ڕووکەشەکەی و داواکاری زمان ئەوە حەملی کردووەتە سەر حەقیقەتەکەی،**

**وە لە تەئویلیدا لە حەقیقەتەوە لا ئەدات بۆ مەجاز، وە درووست نیە زیادکردنی مەجازبۆ صیفەتەکانی الله تعالی) .**

**(الحجة في البيان المحجة : ٤٨٢/١)**

---

**: و اتە وەرگرتنی لەسەرڕووکەش بریتیە لە وەرگرتنی لەسەرحەقیقەتەکەی، وە ئەوەش ڕاستە، بەڵام تەئویل کردنی و اتە وەرنەگرتنی لەسەر حەقیقەتەکەی و گۆڕینی ماناکەی بەگوێرەی ئەوەی هەوا و ئارەزووپێی خۆشە .**

**٤ - ابن تیمیة (٧٢٨ هـ) ئەڵێ :**

(جەهمیەکان **لەسەر سێ پلەن : خراپترینیان زیادەڕۆکارەکانن** کە نەفی ناوەکانی الله و صیفەتەکانی ئەکەن، وە ئەگەر ناو ببرێت بە شتێک لە ناوە جوانەکانی **ئەڵێن ئەوە مەجازە**، لە حەقیقەتدا لای ئەوان ئەو زیندوو نیە و زانا نیە و بەدەسەڵات نیە و بیستن و بینینیشی نیە).

**(الفتاوى الكبرى : ٣٧٠/٦)**

---

**: تەماشا بکە رحمک الله بەوانە ئەڵێت (خراپترینی جەهمیەکان) کە بە ناو و سیفاتەکانی الله تعالی بە (مەجاز) ناو ئەبەن، وە بگەڕێرەوە بۆ پێشتر تەماشا بکە إبن الأثیرو القرطبي و عز بن عبدالسلام و النووي دەبارەی سیفەتەکانی الله تعالی ئەڵێن (مەجاز)، کەو اتە ئەوزەندیقانە لە خراپترینی جەهمیەکانن قبحهم الله تعالی .**

٥ - ابن قیم (٧٥١ ه) ئەڵێ :

(ئەم طاغوتە موتەئەخیرین لکان پێوەی، وە موعەطیلەکان ڕوویان تێکرد، کردیان بە قەڵغانێک، خۆیان پێ پاراست لە تیری هێرشکاران، وە بەهۆیەوە لایاندا لە ڕاستیەکانی وەحی ڕوون و ئاشکرا) .

وە هەروەها ئەڵێ :

(دابەشکردنی لەفزەکان بۆ حەقیقەت و مەجاز نە دابەشکردنێکی شەرعیە، وە نە عەقڵیە، وە نە زمانەوانیشە، ئەوە زاراوەیەکی ناڕوونە، وە زاراوەیەکە داهێنرا دوای سێ سەدەکەی کە ڕێزداربوون بە دەقەکان، وە داهێنرا لە لایەن موعتەزیلە و جەهمی و ئەوەشی کە ڕێگای ئەوانی گرتە بەر لە موتەکەلیمین) .

(الصواعق المرسلة على الجهمية والمعطلة)

---

: دووبارە بە جوانی وتەکەی بخوێنەرەوە و بزانە چۆن وەسفی عەقیدەی ئەشعەریە جەهمیەکان ئەکات .

٦ - ابن رجب (٧٩٥ ه) ئەڵێ :

(وە بانگەشەیان کرد - واتە جەهمیەکان - کە ئەوەی لە کیتاب و سوننەت هاتووە لەوەدا لەگەڵ زۆری و بەربڵاویەکەیدا لە بابی فراوانخوازی و سنور

تێپەڕاندنە، وە حەمل ئەکرێتە سەر ئەو مەجازاتەی کە دوورە لە زمان، **وە ئەمە لە گەورەترین دەرگاکانی درز تێخستنە لە شەریعەتی موحکەمی پاک، وە ئەوە هەمان جۆری حەملی باطنیەکانە کە دەقەکانی هەواڵەکانی غەیب وەک بەهەشت و دۆزەخ حەمل ئەکەنە سەر مەجاز بەبێ حەقیقەت**، وە دەقەکانی ئەمر و نەهی حەمل ئەکەنە سەر هەمان شت .

**وە ئەمە هەمووی دەرچوونە لە دینی ئیسلام، وە زانایانی سەلەفی صالح و پێشەوایانی ئیسلام وەک الشافعي و أحمد و جگە ئەوانیش پێیان باش نەبووە قسەکردن تێیدا، وە ئاگاداریان لێداوە لە ترسی کەوتنە ناو نمونەی ئاوەوە، ئەگەر بێتو ئەو پێشەوایانە بیانزانیایە کە حەمل کردنی دەقەکان لەسەر ڕووکەشەکان کوفرە پێویست بوو ڕوونی بکەنەوە، وە ئوممەتی لێ ئاگادار بکەنەوە، لەبەر ئەوەی ئەوە لە تەواوێتی ئامۆژگاریە بۆ موسڵمانان، چۆن ئەبێت ئەوان ئامۆژگاری ئوممەتیان کردبێت لەوەی پەیوەستە بە حوکمە کرداریەکان، وە وازیان لە ئامۆژگاری کردنیان هێنابێت لەوەی پەیوەستە بە بنچینەی بیروباوەڕەوە، ئەمە لە باطلترینی باطلە)**.

**(فتح الباري لإبن رجب : ٢٣٠/٧)**

والحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على خاتم الأنبياء والمرسلين

وعلى آله وصحبه أجمعين